# یادگە و بیرخۆهێنانەوە

## تەرکیز - نەخشە زەینییەکان - لەبیرچوونەوە

د. ئیبراهیم فەقێ

وەرگێڕانی: سامان مامڵێسی






238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

**پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚**

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_






ناوی کتێب : با لێبوردە بیت

جۆری کتێب : ڕۆمان



ناوی کتێب : سەحەر

ناوی نوسەر : سەلاحەدین دەمیرتاش

جۆری کتێب : چیرۆک



ناوی کتێب : باوکی دەوڵەمەند و باوکی هەژار

ناوی نوسەر : ڕۆبێرت کیۆساکی



ناوی کتێب : ژیانی پێغەمبەران

جۆری کتێب : ئاینی



ناوی کتێب : بۆ کوڕان و کچانم 50 موم بۆ ڕوشنکردنەوەی ڕێگاکان

ناوی نوسەر : د. عبدالکریم بکار



ناوی کتێب : گوڕزەیەک بۆ یادکردنەوەی ڕابردوو

ناوی نوسەر : نیکۆلاس سپارکس

جۆری کتێب : ڕۆمان

وەناو خوا، دەهەندە و دڵاوا....

پێشکەش:

لە (د. ئامال فەقێ) و (نانسی) و (ئەرمین) ەوە بۆ باوکیان د. ئیبراهیم فەقێ – ڕەحمەتی خوای لێ بێ- بۆ ئەوەی تا هەتاهەتایە ناوبانگ و زانستەکەی لەنێو خەڵکیدا بمێننەوە.

## دکتۆر ئیبراهیم فەقێ لەچەند دێڕێکدا...

+ دامەزرێنەر و سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی گروپی کۆمپانیا جیهانییەکانی ئیبراهیم فەقێ، کە لەم بەشانەی خوارەوە پێکهاتووە:

- (CTCPHE) سەنتەری کەنەدیی بۆ هێزی ووزەی مرۆڤ.
- (CTCH) – سەنتەری کەنەدیی بۆ خەواندن بە ئاماژە بۆکردن.
- (CTCHD)سەنتەری کەنەدیی بۆ گەشەپێدانی مرۆیی .
- (CTCNLP)سەنتەری کەنەدیی بۆ بەرنامەسازیی زمانەوانی دەماریی.

+ دکتۆرا لە زانستی ئەودیو سروشت–میتافیزیک– لەزانکۆی (میتافیزیک) ی شاری لۆس ئەنجلۆسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

+ دامێنەری زانستی (دینامیکییەتی خۆگونجاندنی مێشکە دەماریی) (NCD).

+دامێنەری زانستی هێزی وزەی مرۆڤ (PHE).

+ ڕاهێنەری پشت پێ بەستراو لە بەرنامەسازیی زمانەوانیی دەماریی(NLP) لە لای دامەزراوەی ئەمریکی بۆ بەرنامەسازیی زمانەوانیی دەماریی.

+ ڕاهێنەری پشت پێ بەستراو لە چارەسەرکردن بە خەواندنی موگناتیسی لە لای دامەزراوەی ئەمریکی بۆ خەواندنی موگناتیسیی.

+Time Line Therapy.( ڕاهێنەری پشت پێ بەستراو بۆ چارەسەرکردن بە هێڵەکانی ژیان.

+ ڕاهێنەری پشت پێ بەستراو لەبواری یادگەدا لەلای پەیمانگەی ئەمریکی بۆ یادگە لە نیویۆرک.

+ ڕاهێنەری پشت پێ بەستراوی گەشەپێدانی مرۆیی لە لای حکومەتی (کیبیک)ی کەنەدیی بۆ کۆمپانیا و دامەزراوەکان .

+ ڕاهێنەری ڕیکیی لەلای سەنتەری ڕاهێنانی ڕیکیی لە کەنەدا و دامەزراوەی ڕیکیی جیهانیی.

+ پلەی ئەوپەڕی شانازیی لەڕەفتاری مرۆییدا وەرگرتووە و دامەزراوەی ئەمریکی بۆ هۆتێلەکان پێی بەخشیوە.

+ پلەی ئەوپەڕی شانازیی لە بەڕێوەبردن و شمەکە فرۆشراوەکان و بازاڕسازیدا لەلایەن دامەزراوەی ئەمریکی. بۆ هۆتێلەکانەوەی پێ بەخشراوە.

+ ٢٣ بڕوانامەی دبلۆمی لە بەرزترین پسپۆڕییەکانی دەروونزانیی وبەڕێوەبردن و شمەکە فرۆشراوەکان و بازاڕسازیی و گەشەپێدانی مرۆییدا بەدەست هێناوە.

+ پلەی بەڕێوەبەری گشتی لە چەندان هۆتێلی ٥ ئەستێرەدا لە کەنەدا هەبووە.

+ چەندان نووسراو و کتێبی هەن و بۆ هەر سێ زمانی (ئینگلیزیی وفەڕەنسی و عەرەبیی) وەرگێڕدراون و زێتر لە ١ ملیۆن دانەیان لێ فرۆشراوە.

+زێتر لە ٦٠٠٠٠٠ کەسی لە ووتار و کۆڕەکانیدا ڕاهێناوە و بە هەر سێ زمانی (ئینگلیزیی و فەڕەنسی و عەرەبیی) قسەی کردووە.

+ پاڵەوانی میسر بووە لەتێنسی سەرمێزدا، لەساڵی ١٩٦٩ وەکو نوێنەری میسر بەشداریی لەپاڵەوانییەتی تێنسی سەرمێزدا کردووە.

+ زۆریەی کاتەکانی ژیانی لە (مۆنتریاڵ) ی کەنەدا بەسەربردووە و، خاوەنی خێزانێکە بەناوی (ئامال) و دوو کچی هەیە، بەناوەکانی (نانسی ) و (نەرمین) .

+ ساڵی ٢٠١٥ لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر، بەهۆی ڕووداوی ئاگرکەوتنەوەوە کۆچیی دوایی کردووە.

## پێشەکی وەرگێڕ..

خوێنەری خۆشتڤی، ئەم کتێبەی بەردەستت هیی نوسەر و گەورە شارەزایەکی بواری گەشەپێدانی مرۆیی و یەکێکە لە ڕێبەرانی ڕەوتی دەروونزانیی ئەرێنیی.

کەسێك هەموو ژیانی خۆی بۆ یارمەتیدان و ڕێ ڕۆشنکردنەوەی دەردەدار و نەخۆش و عەودالآنی بەختەوەریی و شەیدایانی سەرکەوتن و خوازیارانی خۆشبەختی و پێگە بالآکان تەرخان کردبوو.

لەم کتێبەدا باس لە گرینگیی یادگە و جۆرەکانیی و بیرخۆهێنانەوە و لەبیرچوونەوە دەکات و ستراتیژییەتەکانی لەبەرکردن و خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەکان و یاساکانی بەکارهێنانی نەخشە زەینییەکان ڕوون دەکاتەوە و، ئەو ڕێ و شوێن و شێوازانەی پێویستە بگیرێنەبەر بۆ سوودوەرگرتن لێیان لەباشترکردنی یادگەدا، دەخاتە بەردەس.

هەروەك تیشکی خستووەتە سەر ئەقڵی مرۆیی و چەند زانیارییەکی وورد و پوخت لەسەر دەماغی مرۆیی کە تا ئێستا زانایانی دەروونزانی مەعریفەگەرا لەسەریان ڕێککەوتووون. سیفەت و تایبەتمەندیی و نیشانەی هەریەك لە جۆرەکانی ئەقڵی ئاگا و نائاگای دەرخستووە، سا بەڵکو لە

هەڵسوکەوتمان لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتەکاندا وەکو چرایەك سوودیان لێ وەربگرین و لایەنە تاریك و شاراوەکانی پشت ڕەفتارە مرۆییەکانیان پێ بدۆزینەوە و، ڕێگەی بەردەممان بکەینە چراخان.

بەڵێ، پێویستە لەم کورتە پێشەکییەدا ئاماژە بۆ ئەو تێبینییە گرینگەیش بکەم کە هەندێك لە ووشەکانی نێو دەقە عەرەبییەکەم بە ووشەی تایبەت بەکوردیی کردوون و بۆ یەکەمجارە ئەو ووشانەم بەسەر ئەو دەستەواژە عەرەبییانەدا دابڕیوە، وەکو وشەی (مرونة) بە (بارگونجاویی) و (استیعاب) بە (جێکردنەوە) و (خزن) بە (عەمبارکردن) و (تحدي) بە (مەیدانخوازیی) و (عصبي) بە (دەمارگیران ) و (أعصاب) بە (مێشکە دەمار) و (قدرة ) بە (توانا) و (إمکانات) بە (لەباردابوون) و (أداء) بە (بەجێگەیاندن) و(تلقائي) بە (یەکسەرکار) و (تنسیق) بە (ڕێککاریی) و ( مدلول) بە (بەڵگەنما) و (متزامن) بە (هاووادە) و (تداعي) بە (ناوخوازیی) کردوومن بە کوردیی.

بەهیوام مەڵۆیەکم خستبێتە سەر خەرمانی زوبانە شیرینەکەمان و، خزمەتێکم پێشکەش بەخوێنەوارانی لە دڵا شیرین کردبێت.

سامان مامڵێسی

هەولێر/ ئاڵتون سیتی

ڕەمەزانی ١٤٣٨ کۆچیی

حوزەیرانی ٢٠١٧ زایین

## پێشەکی..

ئایا تۆ ناوەکان ...ژمارەکان .... شوێنەکانت بیردێتەوە؟
ئایا ڕوویداوە و کۆششێکی زۆرت کردووە، کەچی لە ناو ئاڵۆکردنەوەکەدا هەموو شتێکت بیرچووبێتەوە؟
ئایا شتی وات بەسەر هاتووە خۆت بۆ چاوپێکەوتنێك ئامادە کردبێت و، کەچی دواتر وڕێنەت کردبێت و دەمت بووبێتە تەڵەی تەقیو؟
ئایا وات لێهاتووە چووبیتە ژوورێك و لەبیرت کردبێت بۆچی چوویت؟

کەواتە:

ئەگەر دەتەوێت شتە گرینگەکانت بیرکەوێتەوە، ستراتیژییەتەکانی بیرخۆهێنانەوە فێربیە.
وەرە نێو کاروانی گەشتەکەمان و لەخۆت بپرسە:

چیت لە کتێبی (یادگە و بیرخۆهێنانەوە) دەوێت؟

..............................................................

چی بەو زانیارییە نوێیانەت دەکەیت؟

..............................................................

ڕادەی سوودوەرگرتنی ئەوانەی لە دەوروبەرتن چەندە؟

..............................................................

# ئەقڵ

مرۆ وەکی زیندەورانی دیکە نییە و خۆی تێربکات و بخوات و بخواتەوە، هەروەك چۆن ئەوان دەلەوڕێن، بەڵکو خودا ئەقڵی پێداوە و ڕاستی لە چەوت پێ جودا دەکاتەوە. دەوانێت سوودبەخش چییە و زیانمەند چییە. بە ئەقڵی دەزانێت چی دەوێت و چیشی ناوێت.

ئەم ئەقڵە هەرکات مرۆ بە جوانی و ڕێکوپێکیی بەکاری هێنا و قۆستییەوە، ئەوە بەریوومە چاوەڕوانکراوەکەی لێ دەچنێتەوە.

ئەگەریش ئەقڵی پشتگوێ بخات و سوودی لێ نەبینێت، ئەوکات شتێك نامێنێتەوە تا بڵێین: لە زیندەوارانی دیکە جودایە.

٤ شتیی سەرەکیی هەن یارمەتیدەرن بۆ ئەوەی بە باشی ئەقڵ بخرێتە کار و جوان بقۆسترێتەوە، هەر یەکێکیشیان چەندان لق و باسی دوور و درێژیان لێ دەبێتەوە.

## Memory پێگە

زانیارییەکانی تێدا عەمباردەکەین، هەموو مرۆیەک ۱٥۰ ملیار خانەی دەماریی هەیە، هەر خانەیەکیش لەوانە ۱٥۰ ملیۆن خانەی بچوکتری لێ دەبێتەوە، هەر خانەیەکی دەماریی بچوکیش ۱٥۰ ملیۆن خانەی دەماریی دیکەی لێ بدەبێتەوە و زانیارییەکانی تێدا هەڵدەگیرێت.. ۱٥۰ملیۆن x ۱٥۰ ملیۆن x ۱٥۰ ملیۆن.



**با بزانیت ئەو ڕووبەرەی بۆ عەمبارکردن و پاراستنی زانیارییەکان ڕەخسێنراوە چەندە.**

**یەکەم: بەهاکەی:**

ئەقڵی مرۆیی بەهایەکی گەورەی لە جوداکردنەوەی شتەکان لە یەکدی هەیە، هەروەک ئەو بەهایەی هەیە گەوهەری پێگەی مرۆچە لە نێو باقی دروستکراوەکانی دیکەدا. لەوانەیشە هەر ئەقڵ بریتی بێت لە مرۆ خۆی، نەک ئەو جەستەیەی لە قوڕ دروستکراوە.

لە نێو زیندەوەراندا تێیاندایە لە مرۆ بچێت، بەڵام ئەقڵی نییە. کەواتە ئەقڵ بریتییە لە نرخ و بەهای ڕاستینەی مرۆ.

ئەگەر مرۆ بەهای ئەقڵی بە بەهێزیی و ڕوونییەوە زانی، لێیشی دڵنیا بوو، ئەوە ئەو زانیارییە ئاسۆکانی بەڕوودا دەکاتەوە کە:

## دووەم: تواناکانی ئەقڵ:

ئەقڵ سنوورێکی نییە تێیدا بووەستێت و کۆتایی بێت. تواناکانی زیرەکیی و داهێنان لە پێکهاتەی ئەقڵیدا، لەسەرووی سنوور و وەسفەوەن.

تواناکانی ئەقڵی ناناسێت، مەگر کەسێك بڕوای وابێت کە ئەقڵی قەدرو قیمەتی و پێگەی خۆی هەیە.

جا هەرکات مرۆ گاڵتە بە تواناکانی ئەقڵی خۆی بکات، ئەو توانایانە خۆیان دەشارنەوە و پشتگوێ دەخرێن و هیچ ئەرزشێکیان نامێنێت، چونکی بەهای ئەقڵ بە دەرخستنی تواناکانییەوەیە.

هەرکات تواناکانی ئەقڵ و لەباردابوونەکانیمان ناسیی، ئەوە بەرەو لای ئەمەی خوارەوەمان ڕادەکێشێت:

## سێیەم: ئەرك و کاری ئەقڵ:

ئەرك و کاری ئەقڵ لە داهێنان و نوێخوازیدایە. هەرکات مرۆ ئەقڵی بە باشی بخاتە بزووتن و بە پێی ئەقڵی لەسەر یاساکانی داهێنان بڕوات، ئەودەم دەتوانێت داهێنان بکات.

جیهان پێویستیی بە زۆر شت هەیە، تەنێ ئەقڵیش کەفیلە ئەو شتانە دابهێنێت، چونکی هێزێکی لە ڕادەبەدەری هەس.

دەپرسین: لە کوێ مرۆ ئەقڵی لە داهێنان و دۆزینەوەدا دەخاتە کەڕ؟ ئەگەر مرۆ کاری ئەقڵی بە باشی و وردی زانی و بە لێهاتوویەوە بەر ئەرکە گەیشت، ئەوە پێویستە لەسەریی کە:

## چوارەم: بەگەڕخستنی ئەقڵ:

بەگەڕخستنی ئەقڵ لە هەموو ئەو شتانەدا کە سوودیان بۆ خاوەنەکەی و مرۆڤایەتیش هەیە.

هەر لێرەا بەها و نرخی ئەقڵ خۆی مەڵاسداوە و، سوود لە تواناکانی وەردەگرێت، چونکی تەنێ بۆ ئەوە دروست کراوە کە بە سوود بێت، هیچ سوودێکیش نایەتە دەست، مەگەر بە باشی بخرێتەگەڕ و لە لایەن باشەکانی ژیاندا بۆ بەرژەوەندیی گشتیی بەکاربخرێت.

بۆیە هەر کەس ئەرکەکانی داهێنانکاریی ئەقڵ بۆ تێکدانی ژیان بخاتەگەڕ، ئەوە یانی ئەقڵی لە ئەرکە سەرەکییەکەیدا بە دروستی بەگەڕ نەخستووە، بەڵکو هەر نەیشی ناسیوە.

ئەوە سەلمێنراوە کە ئەقڵی بەئاگا لە خولەکێکدا ٧ بۆ ٩ زانیاریی وەردەگرێت، ئەگەر ئەو ٧ زانیارییە بۆ چەند کۆمەڵەیەك دابەش بکەین و، هەموو کۆمەڵەیەك لە ٧ تا ٩ زانیاریی پێك بێت، ئەوە چەندێتیی زانیارییە جێکراوەکان زێتر دەبێت، بەڵام ئەقڵی نائاگا لە خولەکێکدا ١٢ ملیۆن زانیاریی وەردەگرێت.

د. جۆرج میلەر

## بیرخۆهێنانەوە

بریتییە لە گێڕانەوەی زانیارییەك کە زۆر بەکاردێت لە کاتێکدا دەتەوێت بەکاری بهێنیت.

ئەگەر کێشەیەك هاتە گۆڕێ و بیرت نەهاتەوە، ئەوە بۆ ڕێگەی لەبەرکردنی زانیارییەکە دەگەڕێتەوە.

**ئێستەیش با بزانین هۆکارەکانی بیرنەکەوتنەوە یان هۆکارەکانی لەبیرچوونەوە چین:**



- **ترس – ڕاڕایی – شڵەژان – ماندووبوون – ئازار.**
- **نەبوونی ڕێسا و یاسا – گرینگی پێنەدان – تەرکیز نەکردن – ئاگالێنەبوون.**

- شێوازی نەرێنییانەی قسەکردن لەگەڵ خوددا – شێوازی خۆراز پێدان.
- ئەقڵ تەرکیز لەسەر یەك بیرۆکە دەکات و هەموو ئەو دۆسیانەی پشتگیری لەو بیرۆکەیە دەکەن، دەکاتەوە.

تاقیکردنەوەی زارەکیم هەیە، یان تاقیکردنەوەی سەر وەرەقەم هەیە، یان چاوپێکەوتنی تایبەتم هەس، لەو کانتانەدا بیر لەچی دەکەینەوە؟ تەرکیز لەسەر چی دەکەین؟

من دەچمە نێو هۆڵی تاقیکردنەوەوە ترس سەراپای گیانم دادەگرێت.. کەواتە ئەو بیرۆکەیەی تەرکیزی لەسەر دەکەم بریتییە لە ترس، ئەقڵیش بەدووی ئەو ترسەدا هەموو ئەو دۆسیانەی دیکەیش، جا بیرۆکە یان هەستکردنەکان بن، کە پشتگیریی لە ترس دەکەن، دەکاتەوە.

تۆ کاتێك دەتەوێت بۆ چوونە ژوورەوە دەرگای ئەپارتمانەکە بکەیتەوە، پێوستە کلیلت پێ بێت، لەو کاتەدا بوارێك بۆ تێپەڕین بە دەرگاکەدا دەکەیتەوە تا بچیتە ژووریّ، بەڵام تا دەرگاکە داخرا بێت، یانی تۆ لە دەرەوەی ئەپارتمانەکەیت.

هەروا بەو شێوەیە، تا ئەقڵ تەرکیز لەسەر بیرۆکەی ترس بکاتەوە، بەردەوام ئەو زانیارییانەی بیەوێت لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا بیرخۆیان بهێنێتەوە، لەسەری کڵۆم کراون.

ترسەکە بۆ ڕاڕایی لە بەرانبەر تاقیکردنەوەکان و پرسیارەکان و شێوازەکەیدا دەگۆڕێت.

هەروەك ئەگەر چاوپێکەوتنێکت هەبوو، ترس لە پرسیارەکان و شێوازەکەی...



ئەم ترسە بەرەبەرە بۆ ڕاڕایی پاشان بۆ شڵەژان دەگۆڕێت.

هەموویشیان هەست و گریان گرتووە!

لەم کاتانەدا کەسەکە بە ئەقڵی سۆزگەرا بیردەکاتەوە، کە ئەمانە ئەرکەکانی وین:

- خۆپاراستن لەسەر مانەوە.
- ووزە
- هەست و سۆزەکان
- ڕاکردن و هێرشبردن و بەرگریکردن.



**پوختەی هەموو ئەوەی پێشوو بریتییە لە:**

ئەو سیستەمە زۆر جوانەی ئەقڵ ئەوەیە قەدر و قیمەتی بزانین، تاکو بتوانین ئەرکەکەی ئاشکرا بکەین، بەوەیش ئەرکەکانی لە جوانترکردنی ژیاندا وەکاردەخەین.



## چەند زانیارییەکی سادە لەسەر ئەقڵی مرۆیی

١- دەماغی مرۆیەکی پێگەیشتوو ٣ ڕەتڵ ( ١٢٠٠ × ١٤٠٠ گم) ٢ کیلۆ و ٧٠٠ گرام.

٢- دەماغ نزیکەی ٢٪ ی کێشی لەشی مرۆیەکی پێگەیشتوو پێك دەهێنێت.

٣- زانایان دەماغیان بەسەر ٤ پلدا دابەش کردووە و هەر یەکێکیان ئەرکێکی تایبەتی هەیە:




- پلی دواوە، لە بینین بەرپرسە.
- پلی پێشەوە، بەرپرسە لە: پلاندانان، دەرکردنی بڕیارەکان، چارەسەری کێشەکان و داهێنان و دۆزینەوە.

▪ پلی دیوارەسەر، بەرپرسە لە چارەرکردنی ئەرکەکانی زمانەوانیی و هەستە وردەکان.

▪ پلی لاجانگەکانی ڕاست و چەپ، دەکەونە سەرەوەی گوێیەکان و دەوروبەریان، بەرپرسن لە بیستن، یادگە، واتاکان و زمان.

## دەماغ چۆن خۆراک وەردەگرێت؟

▪ دەماغ ٢٠٪ ی وزەی جەستە سەرف دەکات و، خواردنە سەرەکییەکی خوێنە، چونکی خوێن ئەم ڕەگەزە خۆراکییانەی دەداتێ: گلۆکۆز، پرۆتین، ڕەگەزەکانی کیمایی، ئۆکسجین و ئاو.

▪ دەماغ لە کاتژمێرێکدا ٨ گالۆن خوێن بەکاردەهێنێت، واتە ١٩٢ گالۆن لە ڕۆژێکدا.

▪ زۆربەی خانەکانی دەماغ لە ماوەی نێوان مانگەکانی ٤ بۆ ٧ مانگیی لە کاتی سکپڕیدا دروست دەبن.

▪ مەزاجی تاک نیوەی وەرگیراوە و فێری دەبێت و، نیوەکەیش دیکەیشی لە ژینگەی دەوروبەرەوە بۆی دەمێنێتەوە.

▪ ژیان و کارایی ئەقڵ، بە ئاو و ئۆکسجینەوە بەستراونەتەوە.

▪ دەماغ ڕێژەی لە پێنجدا یەکی ئەو ئۆکسجینەی جەستە بەکاری دەهێنێت، سەرف دەکات.

▪ دەماغ ڕۆژانە پێویستە بە ٨- ١٢ کوپ ئاوە، تاکو بە چالاکیی و کارایی کاربکات.

# ئـــەقــــلی بەئاگا

**سیفەتەکانی بریتین لە :**



- لـەو شـتـە تێـدەگات کـە ئێسـتـە ڕوودەدات.
- تەرکیزکردنی سنووردارە.
- ئەم بە بەرنامەڕێژیکردنی ئـەقلی ناوەوە – ئەقلی نائاگا– هەڵدەسێت.
- ژیربێژ و شیکەرەوەیە.
- بیرکەرەوەیە.
- دەکرێت بۆ باشتر بگۆڕدرێـت ئەگـەر بـڕوا بکـات، دواتـریش ئـەقلی ناوەوە بۆ باشتر دەگۆڕێت.
- دەکرێت زانیاریی سەرکەوتوو یان ناسەرکەوتوو بە ئەقلی ناوەوە بدات.

## ئەرکی ئەقلی بەئاگا

**٤ ئەرکی سەرەکیی هەیە:**

- ناسینەوەی زانیارییەکان و پاشان ناردنیان بۆ ناوچەی ژیربێژیی لە مێشکدا.

- لەنێوان ئەم زانیارییە و ئەوانی پێشووتر لای بوون، بەراورد دەکات.
- بە شیکردنەوەی ئەم زانیارییانە هەڵدەستێت.
- بڕیار دەدات و پاشان بۆ ئەقڵی نائاگای دەنێرێت، چونکە کۆگاکانی یادگە لەوێدان.



## ئەقلی ئاناگا( ئەقلی ناوەوە)

ئەقلی ناوەوە ئەریتەکانت، وێنە خودییەکی خۆت، متمانەت بە خۆتی تێدایە، جا بۆ ئەوەی متمانەت بەخۆت بەهێزتر بکەیت، ئەوە لە ڕێگەی ئەقلی ناناگاوە دەکرێت.

### سیفەتەکانی ئەقلی ناوەوە:

- بریتییە لە کۆگای یادگە و بە عەمبارکردنی زانیارییەکان هەڵدەستێت.
- ئەقڵێکە لە شتەکان تێ ناگات، بۆیە ناونراوە: ناناگا.
- بە ئەقلی یەکسەرکار ناودەبرێت، چونکی بەڕێگەیەکی یەکسەرکاریی بیردەکاتەوە.
- بە جێبەجێکردنی داواکارییەکانی ئەقلی بەئاگا هەڵدەستێت.



### ڕاهێنانی (١):

### بەکارهێنانی ئەقلی شیکاریی و هێورکردنەوەی ئەقلی سۆزگەرا

- دانیشە با پشتت ڕاست بێت و، دەستەکانت لەسەر پێیەکانت دابنێ کە لەسەر زەوییەکە جێگیربوونە.

• تەرکیزت بخەرە سەر هەناسە هەڵمژین و هەناسەدانەوەت.

• هەناسە هەڵمژین با بە ٤ تەکان بێت.

• هەناسەت لەناو جەستەتدا بۆ ماوەی دوو تەکان بهێڵەوە. با هەناسەدانەوەیشت بە خاویی و ٨ تەکان، ڕێك وەکو ئەوەی مۆمێك بە هەناسە خاوەکانت بکوژێنیتەوە.. ٣ جار تا ٥ جار بڵێ: الحمد لله... الحمد لله... الحمد لله.

• تەرکیز دەکەین و دەبینین لەدوای ئەو کارە یەکەمین بیرۆکە ئەزێنیی دەبێت، پاشان تەرکیز دەخەینە سەر ئەو زانیارییانەی دەمانەوێت بە بیری خۆمانیان بهێنینەوە.

• ئەو کارە دووبارە دەکەینەوە تا بە تەواویی هێور دەبینەوە.



## پێناسەی یادگە

بێگومان بە چەند ڕێگەیەکی جوداواز پێناسەی یادگە کراوە:

- هەندێکیان وا لە یادگەیان ڕوانیوە کە یەك توانایە و خۆتەواوکەرە.

**بۆرۆ هێلگارد دەڵێت:**

بریتییە لە توانای لەبەرکردن و گێڕانەی شارەزاییەکانی پێشتر، یان توانای بیرخۆهێنانەوەیە.

**ڕیتچەر دەڵێت:**

بریتییە لە توانای بوونەوەری زیندوو بەسەر هەموارکردنی ڕەفتارەکەیدا دوای ئەوەی سوودی لە شارەزاییەکەی پێشتری وەرگرتووە.

- وەلێ دەستەی دووەم یادگە بە یەك توانای سەربەخۆ دانانێن و، پێیان وایە لە زنجیرەیەك چالاکیی مەعریفیی پێکهاتووە.

**مایڵ کێبست دەڵێت:**

یادگە بریتییە لە پێکەوگرێدان و لەبەرکردن و دووبارە هێنانەوەی شارەزایی.

**هێنتەر دەڵێت:**

بریتییە لە چالاکیی بیرخۆهێنانەوە، چونکی چەندان چالاکیی و کردەی زۆر بە وشەی یادگەوە بەستراونەتەوە.

یادگەی مرۆیی بە تەوەری کردە مەعریفییەکان دادەنرێت، چونکە درکپێکردن و ئاگایی و فێربوون و زمان و چارەسەری کێشەکان، هەموویان پێویستیان بە ئەندازەیەك لە زانیاریی ز یادەوەریی هەیە.

لە ڕاستیدا بابەتی یادگە چەندان لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە و ئامانجیان ئەوە بووە بزانن **سروشتی یادگە چییە.** چۆن کاردەکات. **بۆچی مرۆ شتی لەبیردەچێتەوە. ئەی بۆچی هەندێك شت دێنەوە بیرمان و هەندێکی دیکەیان نایەنەوە بیرمان. ئایا دەکرێت مرۆ تواناکانی جێکردنەوەی زێتر بکات؟**

زانایانی دەروونناس و فسیۆلۆژیی و هیی دیکەیش هەوڵی ئەوەیان داوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە: **مەبەست لە یادگە چییە؟**

## پێناسەی یادگە:

ئەو بەشەیە لە دەماغی مرۆیی کە زانیارییەکان بەو شێوەیەی لە ماوەی ژیاندا فێریان دەبین، تێیدا کۆدەبنەوە. یادگە تەنێ ئامرازی عەمبارکردن نییە و تەواو، بەڵکو ئامرازی چارەکردن و ڕێککاریی زانیارییەکانە و گۆڕینیانە بۆ شێوەیەلێك کە بکرێت جودا بکرێنەوە و لێیان تێ بگەین.

# سایکۆلۆژیای یادگە

وای پێناسە کردووە کە Santrock:

کردەی پاراستنی زانیارییەکانە بە تێپەڕینی کات لە ڕێی ڕەمز بۆدانان و عەمبارکردن و دووبارە گێڕانەوەیان. هەروەک کردەیەکی مەعریفیی هاوکارلێکی بەردەوامە.

یادگە لە ٣ کردەی سەرەکیی پێکدێت کە: ڕەمز بۆدانان و عەمبارکردن و دووبارە گێڕانەوەن.

- **ڕەمز بۆدانان( شیفرەدانان ):** بریتییە لە کردەی یەکەم بۆ پێدانی واتا و پێکهێنانی مادەیەک تا بتوانرێت عەمبار بکرێت.



- **عەمبارکردن:** لە سیستمی عەمبارکردنی کاتیی و هەمیشەیی پێکدێت.
- **دووبارە گێڕانەوە:** بریتییە لە گێڕانەوەی زانیاریی و شارەزاییەکانی پێشتر کە ڕەمزیان بۆ دانراوە و عەمبارکراون و لە یادگەی دوورمەودا یان کورتمەودادا هەڵگیراون.

## جۆرەکانی یادگە

چەندان نموونە دەرکەوتن و هەوڵیاندا بونیادی یادگە ڕاڤە بکەن و بە پێی چەند پێوەرێك پۆلێنی بکەن، لە نێوبەدەرترین ئەو نموونانە:

### نموونەی ئەتکینسۆن سیڤەر:

کە یادگەی بەسەر ٣ بەشدا دابەش کردووە و، هەر یەکێکیانی بە سەربەخۆ لەوانی دیکە لە قەڵەم داوە: یادگەی هەستەکیی کتوپڕ، یادگەی کورتمەودا و یادگەی دوورمەودا.

### ١- یادگەی هەستەکیی:

هەموو جوداکەرەوە هەستەکییەکان کە دەوری مرۆیان داوە وەردەگرێت، ئەم بەشە یارمەتی پۆلێنکردنی شتەکان بۆ دەنگەکان و شێوەکان و بۆنەکان و پلەی گەرمیی دەدات.

- **جوداکەرەوەکانی ئەم یادگەیە:** زانیارییەکان بۆ ١ تا ٥ چرکە هەڵدەگرێت و، زۆرێك لە زانیارییەکان ڕووی لێ دەکەن، وەلێ بە خێرایی دەپووکێنەوە.

- **ئەركی سەرەكیی:** بریتییە لە زانیارییە سەرەتاییەكان.

**٢- یادگەی كورتمەودا:**

ئەو بەشەیە كە زانیارییە هەستەكییەكان بۆ شێوەیەلێكی جوداكراوە دەگۆڕێت، پێی دەوترێت: یادگەی كاركەر یان پاراستن، (ئەتیكسۆن) بە سەنتەری ئاگایی ناودەبات، چونكی بیرۆكەكان و هەستەكانی تاك لە كاتێكی دیاریكراودا عەمبار دەكات.

- دوو هۆكار هەن شتەكان لە یادگەی هەستەكییەوە بۆ یادگەی كورتمەودا بگوێزرێنەوە، ئەوانیش: ئاگالێبوون و دركپێكردنن.

- **لە جوداكەرەوەكانی ئەم یادگەیە ئەوەیە كە:** ماوەی مانەوەی زانیارییەكان دەگاتە ٢٠ چركە.

**٣- یادگەی دوورمەودا:**

یەكێكە لە گرینگترین بەشەكانی یادگە، دەتوانرێت وا ناوی ببرێت كە عەمبارێكی گەورەیە و بڕێكی گەورە لە زانیاریی و شارەزایی كە تاك لە قۆناغە جوداجوداكانی ژیانیدا فێریان بووە، لەخۆیدا هەڵدەگرێت.

ئەمیان ئەوەندە ڕووبەری جێكردنەوەی ئەوەندە گەورەیە نە دەژمێردرێت و نە كاتیشی بۆ هەیە.

زانیارییەکان لەسەر شێوەی زەینی و ڕەمزیەلێك کە لە یادگەی کورتمەوداوە لە ڕێی شارەزاییە جوداجوداکانەوە فێریان دەبێت، دەچنە ژوورەوە.



**ئەو کردانەی ئەم یادگەیە پێیان هەڵدەسێت:**

یادگەی دوورمەودا بە چەندان کردەی ئەقڵی هەڵدەسێت، کە دەکرێت بوترێت زۆر زێتر و گەورەترن لەوەی یادگەی کورتمەودا پێی هەڵدەسێت. ئەوەیش بەوەی ئەو زانیارییانەی ڕووی لێ دەکەن، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەپارێزێت.

## پوختەی ئەو کردانەی یادگەی دوورمەودا پێی هەڵدەسێت:

### ١- ڕێکخستن و دووبارە ڕێکخستنەوە:

یادگە لە چەند یەکەیەك یان چەند شێوەیەکدا ڕێکیا ن دەخات یان دووبارە ڕێکیان دەخاتەوە.

### ٢- ڕاڤەکردن و پێدانی واتا:

بە شێوەیەك ئەم بەشە واتا بەو زانیارییانە دەدات کە دێن، لەم ئاستەدا ئەوەیش هەیە کە پێ دەوترێت: پلان بۆدانراوە ئیدراکییەکان.
پلان بۆدانراوە ئیدراکییەکان چەند چەمك و بنەمایەکن کە پۆلێن دەکرێن و واتا بە شتەکان دەبەخشن.

### ٣- بەشتنەوەی زانیارییە نوێیەکان بە کۆنەکانەوە:

ئـــــــەمیش کردەکـــــــانی لێکجوداکردنـــەوە و بـــەراوردکردن دەگرێتـــەوە، کـــە کردەیـــەکی دینامیکییــــــە و یارمــــــەتی بیرخۆهێنانـــــەوە و دووبـــــارە گێڕانەوە دەدات.



## هەندێک هۆکار و بارودۆخ هەن کاردەکەنە سەر دووبارە گێڕانەوەی زانیارییەکان و کردەی بیرخۆهێنانەوە:

- **کارتێکردنی پاڵنەرایەتی:**

ئەوە زانراوە بەرەوپێووبوونەوەی مرۆ لەگەڵ هەندێک ڕووداو و وورووژێنەر و زانیاریدا کە گرینگپێدانی دەخرۆشێنن، ئەم شتانە زێتر لەوانی دی لە یادگەدا دەمێننەوە.

- **تەرکیزکردن و ئاگالێبوون لە کاردکەدا :**

هەرچەند ئاگالێبوونی تاک بۆ شتەکان زێتر بێت، بیرخۆهێنانەوەی بۆ ئەو شتانە بەهێزتر دەبێت.

- **شوێنەواری ڕێکخستن و پلاندانان**



## کردەکانی یادگە بریتین لە ٣ کردە:

- پۆلێنکردنی زانیارییەکان.
- توانای عەمبارکردن و هەلگرتنی زانیارییەکان.
- توانای گێڕانەوە و هێنانەوەی زانیارییەکان.



**ڕاهێنانی (٢):**

■ پێش دەسپێکردن بە خوێندنەوە یان کڕینی کتێبێک، یان پێش دەسپێکردن بە فێربوونی شتێك یان داواکاریی پێشکەشکردن بۆ کارێك،

لە خۆت بپرسە:

ئایا هەر بەڕاست دەتەوێت ئەو شتە بکەیت؟

ئایا هەر بە ڕاست دەتەوێت بخوێنیتەوە؟

ئایا هەر بە ڕاست دەتەوێت فێربیت؟

■ پێویستە بە تەواویی درك بە هەموو هەنگاوێکی بڕیاردانت بکەیت.

- ئایا ئەو کارە بۆ تۆ گرینگە؟
- بۆچی بۆ تۆ گرینگە؟
- ئەو کارە بۆ تۆ مانای چە دەگەیەنێت؟

- زیانەکانی جێبەجێکردنی چین؟

- سوودەکانی جێبەجێکردنی چین؟

- ئەدی دیدگەی تۆ لەبارەیەوە چییە؟

■ ئایا دیدگەکەت بۆ ئامانجی بچوکتر و هەنگاوی سادەتر دابەش دەکەیت، تاکو بتوانیت دەست بە جێبەجێکردن و وەدیهێنانی بکەیت؟

- ئامانجەکەت چییە؟

بریتییە لە پێوەندیی هەبوون لەگەڵ خوادا.

- خەڵکانی دی چ سوودێك لەم پێوەندییەی تۆ دەبینن...؟

ئەم پرسیارانە، پێش دەسپێکردن بە شتەکان، گرینگی پێدانمان فێردەکەن، لەگەڵ گرینگی پێدان بە بیرۆکەیەکی دیاریکراویش، ئەقڵ دەست بە تەرکیزکردن دەکات تێیدا، دواتریش ئەو دۆسیە ئەقڵییانەی دیکەیش دەکاتەوە کە پشتگیریی لەو بیرۆکەیە دەکەن.



## ئەرکەکانی یادگەی مرۆیی

١- کردەکانی ڕەمزبۆدانان و شفرەدانان.

٢- کردەی عەمبارکردن و هەڵگرتن.

٣- کردەکانی دووبارە گێڕانەوە.

## یەکەم: کردەکانی ڕەمزبۆدانان و شفرەدانان:

بریتییە لە کردەی گۆڕینی ئەو زانیاریی و هەستە سەرەتاییانەی کە لە جیهانی دەرەکییەوە وەریان دەگرین، بۆ ڕەمز و واتاکان، کە بەڵگەنمای دیاریکراویان لای تاك هەیە.

ئەم کردەیە ڕۆڵێکی بنەڕەتی هەیە لە شێوەکانی ڕەفتاردا، مرۆ دەتوانێت بۆ چارەکردن – وەرگرتن و بیرلێکردنەوە و جێکردنەوە- ی زانیارییەکان، یەکێك لەم دوو ستراتیژییەتەی لای خوارەوە بەکار بخات:

- ستراتیژییەتی چارەکردنی ڕیزبەندکراو.
- ستراتیژییەتی چارەکردنی هاوتەریب.

### ١- ستراتیژییەتی چارەکردنی ڕیزبەندکراو

لەمیاندا چارەکردنی وروژێنەرەکان یەك لە دوای یەك، بە پشتبەستن بە وروژێنەرێکی دیاریکراو، دەکرێت، پاشان بە شێوەیەکی ڕیزبەندکراو و بە پێی گرینگیی ئەم وروژێنەرانە، بۆ وروژێنەرێکی دیکە دەگوێزێتەوە.

## ٢- ستراتیژییەتی چارەکردنی هاوتەریب

لەمیاندا چارەکردنی کۆمەڵێك لە ورووژێنەرەکان لە کاتێکی هاووادەدا دەکرێت، بە شێوەیەك وەڵامی ئەو ورووژێنەرە دەدرێتەوە کە ویستراوە و دەپارێزرێت و، ورووژێنەرەکانی دیکە پشتگوێ دەخرێن.

ئەمە و زانایان لە نێوان چەندان شێوەی شفرەداناندا جوداوازییان کردووە و، لەم شێوانەی خوارەوەدا دەردەکەون:

*شفرەدانانی بینراو* *شفرەدانانی بیستراو*

*شفرەدانانی بەرکەوتن* *شفرەدانانی بەڵگەبوون- بۆ وشەکان.*

- لەوانەیە لە کاتی ڕۆیشتندا کەسێك ببینیت و هەڵوێستیەلی جوان یان دڵتەزێنت وەبیر بهێنێتەوە.



- لەوانەیە بۆنێکی دیاریکراو بکەیت و کەسێك یان هەڵوێستێك یان خواردنێکت وەبیر بهێنێتەوە.
- لەوانەیە گوێ لە گۆرانییەك بگرین و چەند ڕووداو و کەسێکمان وەبیر بهێنێتەوە.

ئەوانە ئێستە ڕاهێنانیا لەسەر دەکەین:

- لە کاتێکدا لەنێو تاقیکردنەوەدایت، پێویستت بە چییە؟
- کاتێك بۆ چاوپێکەوتنێکی تایبەت دەچیت، پێویستت بە چییە؟

▪ ئەگەر هەستت کرد دەمارت گیراوە، پێویستت بە چییە؟

هەمووممان پێویستمان بە ورووژێنەرێکە بۆ هێوربوونەوە بمانگێڕێتەوە.

## دووەم: کردەی عەمبارکردن و هەڵگرتن

بریتییە لە کاری یادگە لەسەر هەڵگرتنی زانیارییە ڕەمز بۆدانراوەکان و تا کاتی پێویستیی تێیدا دەمێننەوە، لە ڕێی کردەی دووبارەگێڕانەوە و ناسینەوەوە، دەزانین زانیارییەکان لەوێدا هەن.

## سێیەم: کردەی دووبارە گێڕانەوە

کردەی دووبارگێڕانەوەی زانیارییەکان لەسەر ئەندازەی هێزی یادگەی دوورمەودا و توانا بەرزەکەی لە عەمبارکردندا ڕادەوەستێت.



ڕاهێنانی (٢):

دەتەوێت شتیەلیکی زۆر بکڕیت، کاتێک دەچیتە بازاڕ، هەندێکیان لەبیر دەکەیت و، دووبارە و سێبارە دەچیتەوە بازاڕ.

▪ مرۆ دەتوانێت شتە ڕیزکراو و ڕێکخراوەکان بە شێوەیەکی خێراتر و ئاسانتر لە شتە نارێکخراوەکان بیربهێنێتەوە.

▪ هەرچەند ڕێکخستنی شتەکان هەرەمەکیی بن، ڕێژەی ئەرکیز و بیرخۆهێنانەوەیش کەمتر دەبن.

هەوڵ بدە بۆ ماوەی ١٠ چرکە سەیری ئەم وشانە بکەیت و دواتر بە ڕیز لەبەریان بکەیت:

"پرتەقاڵ، قەڵەم، سێو، کورسی، ئەناناس
تەختە، کاڵەک، کوولەکە، قوتابخانە، خەیار" ...

دوای هەوڵدانت بۆ لەبەرکردنیان، ڕێگەیەکی دیکەیش هەیە تاقی بکەرەوە:

(پرتەقاڵ . ئەناناس. کاڵەک)
(قەڵەم . تەختەڕەش . قوتابخانە. کورسی)
(سێو. کوولەکە . خەیار)

- هەموو پێداویستیی و ئەو شتانەی دەیانکڕین، لە لیستێکی هاوشێوەدا دابەش دەکەین.. خێرایی... بیرخۆهێنانەوە... ئەنجامدانی ئەرکەکە.
- ناوبەناو پێویستە بۆ ماوەی ٥ تا ١٥ تا خولەک، بۆ ئەرکێن پشوو بدەین.

# شێوەکانی یادگە

(برتراند رسل) لە کتێبەکەیدا (شیکردنەوەی ئەقڵ) یادگە بەسەر دوو شێوەدا دابەش دەکات:

## یادگەی خوو Habit- Memory

خوو بریتییە لە مەیلی بەجێگەیاندنی کارێك لە کارەکان لە ئەنجامی دووبارەبوونەوەوە، تاکو کارەکە دەبێتە شتێکی خودکار، وەکی ڕۆیشتن و نووسین و خواردن و شتی دیکەیش.

کەچی زۆربەی زانایانی دەروونناسی هاوچەرخ ئەم کردەوە خودکارانە لە مەیدانی یادگە دەردەکەن و، تەنێ ئەو شتانە حسێب دەکەن کە بە هەستکردن و مەعریفەوە درکیان پێدەکەین.

وەلێ هەندێکی دیکەیان ئەم کارە ئاساییانە بە کاری یادگە دادەنێن و، ڕاڵەی تێکچوونیان بە لەبیرچوونەوە کردووە، گەرچی لە نەستیشەوە دەردەچن.

## یادگەی مەعریفە(وەهمیی) Knowledge- Memory

ئەو یادگەیەیە کە لە سەرەتای گەشەکردنییەوە لای منداڵ دەردەکەوێت. لای نەخۆش لە کاتی وڕێنەدا دەردەکەوێت، لای کەسی خەوتوو کاتێك خەون دەبینێت دەردەکەوێت.

ئەوەیش بە تەنیشت ئەو وێنانەوەیە کە لە خەون و وڕێنەکردندا بەدوای یەکتردا دێن و، چەند دیمەنێکی ڕابردوو دەگەشێننەوە، خاوەنەکانیان وای نابینن ئەو دیمەنانە لە ڕابردوودا بوون، بەڵکو بە بەشێك لە ئێستەی دەزانن، چونکی بەلای ئەوانەوە کاتێك خەون دەبینن یان وڕێنە دەکەن، ئێستەیە و واقیعییە، لەبەرئەوەی یادگە لە کاتی خەوندا وا تێیدا دەژێت، وەکو بڵێی هەقیقەتە. کەسێك خەون دەبینێت هەندێك جار دەگاتە ئەوەی جووڵەیش دەکات و لە جێگەکەی خۆی هەڵدەسێت و چەندان کاریش دەکات.

هەروەها دابەشکردنێکی دیکەیش هەیە کە بەسەر ٣ شێوەدا دابەشی دەکات:

## یادگەی چالاك( باڵا ):

یانی بە پێی دیدگەی خاوەنەکەی، زانیارییەکانی گرینگ و ئێستایی لەخۆ دەگرێت.

ئەو یادگەیەیە کە هەڵسوکەوتەکانمان پشت بەو دەبەستن. لەو پەنجەرەیە دەچێت کە لە ڕێی بەخشین و وەرگرتنەوە مامەڵە لەگەڵ جیهاندا دەکات.

## یادگەی زانیارییە پشتگوێخراوەکان( سست ):

وەکو یادەوەرییەکان، چالاکیی و ئامادەگیی ئەم یادگەیە جۆراو جۆرە.

**یادگەی ناوەند:**

ئەم یادگەیە زانیاریی و ڕووداویەلی دووبارەوە بوو، یان زۆر ووروژێنراو لەخۆ دەگرێت.

هەروەك دابەشکردنێکی دیکە هەیە و قبولکراوە، یادگەی بەسەر ۳ شێوەدا دابەش دەکات، ئەوانیش:

## ١- یادگەی کتوپڕ Immediat Memory:

ئەو یادگەیەیە گرینگیی بەو ڕووداوانە دەدات کە کتوپڕ ڕوودەدەن و چوند چرکەیەکن، ئەو یادگەیەیە ئەم وشانەی ئێستە دەیانخوێنیتەوە لەخۆدەگرێت. لەگەڵ ڕووداوەکانی هەنووکەدا مامەڵە دەکات. یان ژمارەی ئەو تێلیفۆنەی ئێستە لە ڕێبەرەکە وەرتگرتووە عەمبار دەکات. ئەو شتانەیش وەکو باوە لە ماوەی چەند خولەکێك یان چرکەیەکا لەبیردەچنەوە.

## ٢- یادگەی کورتمەودا Short term Memory:

ئەو ڕوودلوانەی ئێستە ڕوودەدەن لە خۆدەگرێت تا جێگیر دەبن و پاشان بەرەو یادگەی دوورمەودا بەرێیان دەکات.

## ٣- یادگەی دوورمەودا Tall term Memory:

ئەو زانیارییانە لەخۆ دەگرێت کە لە ڕابردوویەکی دووردا ڕوویانداوە. یادگەیەکی جێگیرکەرە و، زانیارییەکانی ناوی بەرگەدەگرن و لە ئەگەری

نێکچوونی خانەیەکی مۆخیشدا هەر دەمێننەوە و، بە درێژایی ژیان بەردەوامن.

**یادگەی کارکەر:**

دەکەوێتە شوێنی دیاریکراوی دەماغەوە کە پلی پێشەوەی توێکڵە مۆخە. لەم یادگەیەدا کارلێکی کتوپڕ لە نێوان ئەو شتەی ئێستە وەردەگیرێت و ئەو زانیارییانەی پێوەندیدارن و یەکسەر دەگەڕێنرێنەوە بۆ تەولوکردن و بەراووردکردن و پێکەوەبەستن، ڕوودەدات، بۆ ئەوەی بیرۆکەی نوێ لەدایك بن و، بڕیارێکی کتوپڕ بدرێت.

هەربۆیە یادگەی کارکەر زۆر بە پێویست دادەنرێت و بۆ تێگەیشتنی زمان و فێربوون گرینگە، ئەوەی وای لێکردووە هەندێك لە زانایان بە تەختەی نووسینی بچوێنن، یانی تەختەی نووسینی ئەقڵ.

**یادگەی پێکەوەبەستەر:**

ئەو یادگەیەیە زانیارییەکان بۆ ماوەیەکی دوور بەبێ ئیش پێکردنیان عەمبار دەکات، تا کاتی گێڕانەوەیان لە لایەن ئەقڵەوە لە کردەکانی ئێستەدا.

## یادگەی بینین... یادگەی بیستن

هەندێك کەس یادگەیەکی بینینی بەهێزیان هەیە، بە شێوەیەك دەتوانن ئەو شتەی بۆ یەکجاریش بینیویانە بە باشی بهێننەوە یادی خۆیان.

لەولایشەوە کەسانێکی دیکە هەن یادگەیەکی بیستنی بەهێزیان هەیە. بە شێوەیەک هەر گوێیان لە دەنگی بوو، یەکسەر کەسەکە دێتەوە بیریان. یان ئەگەر کەسێک بە دەنگێکی بەرزەوە لە لای ئەمان شتێک بخوێنێتەوە. دەتوانن لەبەری بکەن و لە هەر کاتێکدا بێت دووبارەی بکەنەوە.

## یادگەی بۆنکردن:

چەند توانایەکی دیکەیش لای هەندێک کەس هەن کە یادگەیەکی بەهێزی بۆنکردنیان هەیە.

جاری وا هەیە تۆ دەتوانیت بزانیت چی خواردنێک لە چێشتخانەکەدا لێ دەنرێت، ئەو پێکهاتانەی تێی دەکرێت، کەچی لە ژووری دانیشتن دانیشتوویت. ئەمەیش شتێکی ئاساییە.

وەلێ دەگمەنە ئەو یادگەیەی کابرای پیری عەتار هەیەتی لای کەسێکی دیکە هەبێت، چونکی ئەم پیاوە دەتوانێت پێکهاتەکانی جودلجودای ئەو بخوردانە، بە تەنێ بۆنکردنێک بناسێتەوە. هەندێجار پێکهاتەکانی لە ١٠ جۆر زێترن.

ئەوەی لێرەدا روونە، ئەوەیە یادگەی کابرای عەتار بە چەندان راهێناندا تێپەڕیوە.

هەروەک یادگەی بۆنکردن لای هەندێک جۆری سەگ زۆر لە هی مرۆڤ بەهێزترە، بۆیە سەرکەوتنی سەگی پۆلیسیی لە راوەدوونانی دز و دۆزینەوەیاندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بۆنکردنە بەهێزەی هەیانە.

## یادگەی چەشتن و یادگەی بەرکەوتن:

ئەو کەسانەی هەستی بینینیان لەدەستداوە، هەستی بەرکەوتن لایان زۆر بەهێزە و لە دیاریکردنی شتەکان و ناسینەوەیاندا، بە تەواوی پشت بەو هەستە دەبەستن.



## یادگەی گیانەوەر و ڕووەک:

یادگە لە بچووکترین بوونەوەری زیندوودا هەیە، بۆیە دەبینیت بوونەوەرە زیندووە سەرەتاییەکان شوێنەواری ئەو گۆڕانکارییانەی کاریان تێدەکات، دەپارێزن.

جۆرە گوڵێک هەیە لەگەڵ تیشکی خۆردا دەجووڵێت، ئەو جووڵەیە هەندێک کات بەردەوام دەبێت، تەنانەت دوای داهاتنی تاریکیش.

هەندێک لە گیانەوەرە ئاوییەکان لەگەڵ هەڵکشانی ئاوی دەریاکاندا دێنە کەناراوە لماوییەکان و، لە کاتی داکشانی شەپۆلەکان و ئاوەکەدا

دەچنەوە نێو دەریا. ئەگەر ئەو گیانەوەرانە بکەیتە نێو شووشەیەکەوە، دەبینیت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك ئەو جوولانە دووبارە دەکەنەوە.

دکتۆر (مارتن) لێکۆڵینەوەی لەسەر جۆرێك لە کرم کە لە کەناراوەکان دەژین و پێی دەڵێن:(کونفولوتا) کرد، ئەزموونەکانی ئەوەیان دەرخست ئەو خولە زیندەییانە لەگەڵ کۆتایی هاتنی ڤرۆژێنەرەکەیشدا هەر بەردەوام دەبن.

هەروەها زانایان لە ڕووی لەبەرکردن و وەرگرتنەوە بەدوای گەشەی یادگەی جۆرەها گیانەوەردا گەڕاون و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردوون، وەکی ماسییەکان و باڵندە و شیردەرەکان.

## ئایا یادگە هەیە بەهێز بێت و هەیش بێت لاواز؟

شتێك نییە بە ناوی یادگەی بەهێز و یادگەی لاواز، وەکی هەندێك کەس بۆی چوون.

ڕاستییەکە ئەوەیە ئەم جۆرە کەسانە یادگەیەکی ڕانەهێنراویان هەیە. بۆیە ئەو زانیارییانەی کە وا دەردەکەوێت مرۆ لاپەڕەکانی پێچابێتەوە، تا ئێستەیش لە یادگەدا ماون، بەڵام بۆ ئەوەی دەربکەونەوە، پێویستیان بە دووبارە گێڕانەوە هەیە. یادگە ئەو زانیارییانەی پێوەستن بە ڕابردوویەکی دوورەوە لەخۆ دەگرێت و، ڕەگداکوتراوتریشن، ئەوانەن بەرگە دەگرن و لەگەڵ تێکچوونی خانەکانی مۆخیشدا بەردەوم هەر دەمێننەوە.

# جوداوازیی لەنێوان یادگە و خەیاڵکردنەوەدا

یادگە ئەو وێنانە دەگرێتەوە کە پێشتر و لە ڕابردوودا درکی پێکردوون و لە یادگەدا عەمباری کردوون، هەروەکو چۆن عەمبار شتەکانی تێدا هەڵدەگیرێت.

کەواتە بیرخۆهێنانەوە لەم حاڵەتەدا واقیعە، وەلێ خەیاڵکردنەوە واقیع نییە، ئێمە ئازادین خەیاڵ لەبارەی هەر شتێکەوە بکەین.

**(کانت) لەم بارەیەوە دەڵێت:**

( ئەگەر خەیاڵم لە خانوویەك کردەوە، دەتوانم سەربانەکەی وا بهێنمە پێش چاوی خۆم لای خوارەوەیەتی و، بناغەکەیشی لای سەرەوەیە، بەڵام کاتێك خانوویەکم وەبیردێتەوە، بەردەوام بناغەکەی لای خوارەوەیە و سەربانەکەی لەسەرەوەیە).

ئا ئەمەیە جوداوازییەکە.



## ڕاهێنانی (٤):

### ڕاهێنان بۆ ناسینی سیستمی نواندن:

هەوڵ بدە زانیارییەکان بگێڕیتەوە و شێوازی تایبەتی خۆت تۆمار بکە، بۆ ناسینەوەی ئەوەی بزانە چ سیستمێك بۆ تۆ گونجاوە..

- ژمارە مۆبایلی براکەت چەندە؟
- ئایا لەسەر شێوەی ( وێنە.. دەنگ) هاتەوە بیرت؟
- چۆن قەڵەمدادەر بەکاردەهێنیت؟
- لە یەکەم ڕۆژی خوێندنی ئامادەیی، حاڵت چۆن بوو؟
- ڕەنگی ئەو جلوبەرگانەی دوێنێ پۆشیبووتن چی بوون؟
- ئێستە باشترینی جلوبەرگەکانت لە کوێن؟
- چۆن دەگەیتە نزیکترین وێستگەی پاس لە ماڵتانەوە؟

دەبینیت زێتر لە سیستمێکت بەکارخست، هەر ئەویشە ڕێگە دروستەکە بـــۆ کردنـــەژوورەوەی زانیاریـــەکان، چـــونکی مـــرۆ بـــەهۆی پێکەوەبەستەرەکانەوە شتی وەبیردێتەوە.

## مەبەست لە بیرخۆهێنانەوە

کردەی دووبارەگێڕانەوەی یەکێك لە شارەزاییەکانی پێشترە لە ئەقڵەوە. واتە بیرخۆهێنانەوە پشت بەو شتانە دەبەستێت کە مرۆ پێشتر درکی پێکردوون و فێریان بووە و لە زەینیدا پاراستوونی، بە شێوەیەك دەتوانێت لە کاتی گونجاو و بە ویستی خۆی، وەبیر خۆیان بهێنێتەوە.



## شێوە و ئاستەکانی بیرخۆهێنانەوە

- ناسینەوە.
- دوای ئامادەکردنەوە، یان دووبارە گێڕانەوە، یان بیرخۆهێنانەوەی گشتیی.
- ناوخۆلزیی و پێکەوەبەستران.



**ڕاهێنانی (٥):**

- هەردوو شتێك پێکەوە ببەستەوە:

**پاقلە / عەرەبیی / قەڵەو / زاگرۆس بۆ فرۆکەوانیی / منداڵ / جگەرە / ئاقیکردنەوە / لەخۆوە میزبەخۆداکردن**

- بە شێوەیەکی خەندەئامێز و جوڵاو پێکیانەوە ببەستەوە، دەنگێکی تایبەت بێت بەلاتەوە، هەوڵ بدە و خەیاڵیان لەبارەوە بکەیت و هەست بە زانیارییەکە بکەیت.

- ڕێگەیەکی دیکە بۆ بەستنەوەی پێداویستیی و شتەکان بە یەکترەوە، ڕێگەی چیرۆکە.

■ وا خۆت بهێنەرە بەرچاو کە لەسەر عەرەبانەیەکیت و پڕ بە گەرووت هاوار دەکەیت: وەرە بۆ پاقلە، لێرەوەیە پاقلی کوڵیو. دواتر بەخۆت و عەرەبانەکەتەوە بەرەو کۆمپانیای زاگرۆس بۆ فرۆکەوانی ڕۆیشتیت. فڕۆکەکە نیشتەوە و تۆیش دەستت کردەوە بە پاقلە فرۆشییەکەی خۆت، لەوناوە کابرایەکی قەڵەو هات و، مەنجەڵە پاقلەکەی هەموو خوارد، لە ناو فرووکەکەدا منداڵێك هەبوو شووشەیەك ئاوی پێ بوو، هەرکات کەسێکی ببینیایە جگەرەی بکێشایە، ئاوی پێدا دەکرد، جگەرەکە دەکوژایەوە و منداڵەکەیش دەیدایە قاقای پێکەنین، کەسێکی دیکە لە هەمان فڕۆکەدا هەبوو تاقیکردنەوەی هەبوو، لە ڕێگە دوور و درێژەدا بەردەوام بە ڕێگەی ئاودەستەوە بوو.

■ هەمان ڕێگە لە هەموو زانیارییەکاندا ڕیزکراو و ڕێکخراو دەبن و بەدووی یەکدا و بەڕیز دێن.

■ لەگەڵ زانیارییەکەدا دەچینە نێو ووردەکاریی وادەی کاتیی و شوێنییەوە.

■ بۆ ئاسانکردنی قۆناغی بیرخۆهێنانەوە، بە چەند شتێکیانەوە دەبەستینەوە، یان بە چیرۆکێکی خەیاڵییانەوە دەبەستینەوە.



## ئەو هۆكارانەی كاردەكەنە سەر بیرخۆهێنانەوە

### مەودای یادگە:

كەسی پێگەشتووی ئاسایی بەلای كەمەوە دەتوانێت بۆ ماوەی یەك خولەك شتەكان بەبیر خۆی بهێنێتەوە، ژمارەی تێلیفۆنێك لە ١٠ ژمارە پێكهاتبێت، لەوانەیە قورس بێت بە ئاسانی بیهێنینەوە بیر خۆمان، تەنانەت ئەگەر دوو جاریش گوێمان لێ بێت.

**بەلام مەودای یادگە بەپێی گۆڕانی تەمەن، جوداوازە.**

### جۆری بابەتی تەركیز لەسەركراو:

لە هەندێك بابەتدا هەست بە گرانییەكی زێتر دەكەین بۆ بیرهێنانەوەیان لە هەندێكی دیكە.

لێكۆڵینەوەكان ئەوەیان ڕوون كردووەتەوە هۆنراوە لە پەخشان ئاسانتر دێتە بیر، پەخشانیش ئاسانتر لە بابەتی بێ مانا دێتە بیر.



هەروەك لێكۆڵینەوەكان ئاماژیان بەوە كردووە كە بابەتێك مانای زۆر بێت لە بابەتێكی مانا لاواز یان پێكەوەنەبەستراو زووتر دێتەوە بیر.

**ڕاهێنانی (٦):**



## بیرخۆهێنانەوەی کەسانی گرینگ لە ژیانماندا..

جاری وا هەیە کەسانێك دێنەوە ڕێمان، کەچی ناویانمان لەبیر نەماوە و، تووشی شڵەژان دەبین.

بۆیە پێویستە ڕاهێنان بکەین و دووباری بکەینەوە، تاکو چالاکتر بێت.

- ناوی ئەو کەسە بۆ یەکەم جار کە بینیت، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، زۆر دووبارە بکەرەوە.
- ناوی کەسەکە بە کەسێکی دیکە یان شتێکەوە ببەستەوە، پێش ئەوە ناوەکەی بە سەر و سیمایەوە ببەستەوە، شتێکی گرینگ لە دەم و چاویدا بدۆزەرەوە.
- ناوەکەی بە ڕەنگی ئەو جلوبەرگانەوە ببەستەوە کە لەبەریدان.
- ناوەکی بە شوێنەکە، کاتەکە، بۆنەکە و ڕۆژەکەوە ببەستەوە.
- لە خەیاڵی خۆتدا وێنەیەکی جوانی بۆ بنەخشێنە و دەنگێکی جوداکەرەوەی بۆ دابنێ.

# لەبیرچوونەوە



بریتییە لە لایەنە نەرێنییەکەی بیرخۆهێنانەوە، یان شکستهێنانە لە توانای بیرخۆهێنانەوەی هەندێک لەو شارەزاییانەی پێشتر فێری بووە.

بێگومان لەبیرچوونەوە هەندێک جار سوودبەخشیشە و، هەموومان تووشی دەبین، بەڵام بە پلەی جوداجودا.

## ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر لەبیرچوونەوە:

- تێپەڕینی کاتێکی زۆر بەسەر ئەو شارەزاییانەی پێشتر فێری بووە، هۆکارێکی سەرەکیی لەبیرچوونەوەیە.
- بەکارنەهێنان و بەکارنەخستنی شارەزاییەکانی پێشتر.
- دووبارە نەکردنەوەی ئەو شتانەی فێری بووە.
- تێکەڵبوونی زانیاریی و شارەزاییەکان لەگەڵ ئەو شتانەی لەیەکەوە نزیکن.
- کردەی چەپاندن کە کەسەکە لە ئەنجامی بەرەوڕووبوونەوەی هەندێک هەڵوێستی هەڵچوونی توندەوە.
- گۆڕانی گرینگیپێدانی کەسەکە بە بابەتەکە.
- هەندێک هۆکاریش هەن بە کەسێتیی تاکەکەوە بەستراونەتەوە و کاریگەرن.



## ڕاهێنانی (٧):



**ڕاهێنان لەسەر تەرکیز..**

**- خاڵی تەرکیزکردن**

**- پێچەوانە ژمێر**

**- درێژەی وێناکراوەکان**

**- لالێواری لووت و تەرکیزکردن لەسەر هەناسەدان**

▪ خاڵی تەرکیزکردن: دەست بە هەناسەدان بە ڕێگەی ٤- ٢-٤ بکە و ٣ جار دووبارەی بکەرەوە و تەرکیز بخەرە سەر زانیارییەکە.

▪ ئەگەر بیرت پەرشوبڵاو بوو، دەست بە پێچەوانە ژماردن بکە، ئەگەر هەڵەمان کرد، جارێکی دی بە پێچەوانەوە بکەوە ژماردن.

▪ درێژەی وێناکراوەکان، سەیری وێنەکە بکە و چاوت بنووقێنە و خەیاڵی لێ بکەرەوە، ورد و درشتی وێنەکە بە خەیاڵ بنووسە.

▪ تەرکیز بکەرە سەر لالێواری لووت و لە بارێکی جێگیردا، هەناسەدانی ئەقلی شیکاریی و هەڵچوونیی ئەنجام بدە.

▪ دووبارەکردنەوەی ڕاهێنانەکان ستراتیژییەتێکی نوێ فێری مۆخ دەکات، ئەویش بریتییە لە زێتربوونی ڕێژەی تەرکیز و، وەدیهێنانی باشترین ئەنجام.

## پێوەندیی شلەژان بە لاوازبوونی هەڵی فێربوونەوە:

لە کاتی شلەژاندا ڕژێنی سەرگورچیلە هۆرمۆنی (کۆرتیزۆل) بە چڕی دەردەدات، لەوەیشەوە زنجیرەیەک پەرچەکردار سەرهەڵدەدەن و، سیستمی بەرگریی لاواز دەبێت، ماسولکەکان تووند دەبن، فشاری خوێن زێتر دەبێت و، ڕێ لە فێربوون دەگرێت. بەرزبوونەوەی بەردەوامیی ڕێژەی (کۆرتیزۆل) دەبێتە هۆی مردنی خانەکانی دەماغ.

## شوێنەواری شلەژان بەسەر دەماغ و کردەی فێربوونەوە:

- لاوازبوونی یادگە.
- لاوازبوونی توانای جوێکردنەوەی چی گرینگە و چیش گرینگ نییە.
- شلەژانی بەردەوام فێرخواز بەرەوڕووی نەخۆشییە جوداجوداکان دەکاتەوە.
- لاوازبوونی هەستکردن بە نرخاندنی خود.

## کاریگەریی هەڵچوونەکان لەسەر کۆششکردن (سەعیکردن):

بێگومان تێفکرین تەنێ لە دەماغدا ڕوونادات، بەڵکو بەسەر بەشە جوداجوداکانی جەستە و دەماغدا دابەش بووە، دەماغیش زێتر وەکو ڕژێنێک کاردەکات نەک وەکی کۆمپیوتەرێک.

▪ هەڵچوونەکان لە تەرکیزکردن و دانانی کارە لەپێشترەکاندا یارمەتی ئەقڵ دەدات.

▪ هەڵچوونەکان پێکهێنەرێکی سەرەکی کردەی فێرکردنن و یەکەمین هەنگاوی فێربوونن.

▪ تێکەڵاوبوونێکی گەورە لەنێوان ئەقڵ و هەڵچوونەکاندا هەیە.

**ئەقڵ دەڵێت: ئامانجەکەت دابنێ، هەڵچوونەکانیش بەرەو لای ئامانجەکە گەرموگوڕت دەکەنەوە.**

کەواتە هەستکردن بە ڕەزامەندیی و ئەوەی تۆ جودایت لە خەڵکی دی، دەبێتە هۆی هاندانت بۆ کۆششکردن و سووربوون و هەوڵدان، بەدوای ئەوەیشدا سەرکەوتن بەرێوەیە.

وەلێ هەستکردن بە چۆکدادان و خۆبەکەمزانین، دەبنە هۆی خاوبوونەوە و پاڵدانەوە لە کۆششکردن، بەدوای ئەوەیشدا شکست بەرێوەیە.



# جۆرەکانی بیرکردنەوە

١- بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

٢- بیرکردنەوەی داهێنەرانە

٣- بیرکردنەوەی زانستیی

٤- بیرکردنەوەی لۆژیکیانە

٥- بیرکردنەوەی مەعریفیی

٦- بیرکردنەوەی ژوور مەعریفیی

٧- بیرکردنەوەی خورافیانە

٨- بیرکردنەوەی خۆسەپێنەرانە

٩- بیرکردنـــەوەی هاوگونجانـــدن یـــان هاوڕێگە





**ڕاهێنانی (٨):**

**بیرخۆهێنانەوەی ژمارە گرینگەکان لە ژیاندا..**



- دەکرێت ژمارەکان بەسەر چەند کۆمەڵەیەکدا دابەش بکرێن.
- دەکرێت ژمـارە بـە وێنەیەیـەکی جوڵـاوەوە ببەسترێتەوە.
- دەکرێت لە کاتی دووبارە وتنەوەیدا دەنگی خۆت بیر بهێنیتەوە.

- پەنجەکانت بەکار بهێنە و وەکی ئەوەی داوای گێڕانەی ژمارەیەک بکەیت.
- نووسینی ژمارەکە بە خێرایی لەسەر لاپەڕەیەک.
- هەوڵی بەستنەوەی ژمارەکان بە ژمارەیەلێکی گرینگ بەلاتەوە، وەکو بەرواری لەدایکبوون و ژمارەی خانوو.
- هەوڵی بیرخۆهێنانەوەی ژمارە دووبارەوەبووەکان لە ڕێی چیرۆکێکی پێکەنیناویی و جوڵاوەوە.



## ڕێگەکانی باشترکردنی بیرخۆهێنانەوە و باش لەبەرکردن

توانای بیرخۆهێنانەوەی دروست، پشت بە دروستی سێ هەنگاوی گرینگ کە کردەی بیرخۆهێنانەوەیان پێ تەواو دەبێت، دەبەستێت. ئەوانیش:

- **درکپێکردن ( پەیپێبردن ).**
- **مەعریفە.**
- **پاراستن ( دەسپێوەگرتن ).**



## ئامرازە کردەییەکان بۆ بەهێزکردنی یادگە

یەکەم: ئامرازە کردەییەکان بۆ چالاککردنی یادگە.

دووەم: پاراستنی ئەقڵ لە ئەریتە خراپەکان.

## هەوڵبدە بەم ڕێگەیانە بۆ زیاترکردنی یادگە و بیرخوێندنەوە:

- ئاوەڕۆکەکە هەڵبژێرە و، ئامانجی بیرخۆهێنانەوە بنووسە.
- ئەو شتانەی پێشبینی دەکەیت بیرت بێتەوە، دیاری بکە.
- ئەو زانیارییانەی بە تەمایت بیرت بێتەوە، ڕێک بخە.
- ئەو زانیارییانەی بە تەمایت بیرت بێتەوە، بخەڕوو.
- ستراتیژییەتەکانی ڕاهێنان و دووبارەکردنەوە، هەڵبژێرە.



## چارەسەری لاوازی یادگە

- بەهێزی بڕوا و نزیکبوونەوە لە خودا.
- رێگەی دووبارەکردنەوە بگرە بەر و، ئەو شتەی دەتەوێت بیکەیت، زانیارییەکانی بنووسەرەوە.
- زۆر خواردنی سەوزە و میوە و خواردنە دەریاییەکان و، دوورکەوتنەوە لە خواردنی ئامادەکراو و لەقوتووکراو. ئەو خواردنەوانەیشی یارمەتی گەیاندنی خوێن بە دەماغ دەدەن: زەنجەفیل، دارچینی، سرکەی سێو، بادەمی سووری، بادەم، رازیانە، هەنجیر و سپێناخ.
- پاراستنی تەندروستی گشتیی، بە تایبەت خەوتن و وەرزشکردن.



راهێنانی (٩):



* ئەم لیستە بە پەیوەندیی و لەسەر رێگەی پەیوەندیی دار، بیر خۆت بهێنەرەوە:

**لم، فرۆکە، شێر، کتێب، تێنس، ئاوپرژێنەر، پانتۆڵ، عەزێ، پاسکیل، ئاودەست.**

خەیاڵی دارێک بکەرەوە لە ژێریدا لمی سوور هەبێت.

فرۆکەیەک دوو باڵی هەیە و، کلیلێکی بۆ ڕووناکی تێدایە.

شێرێک لەسەر کورسی ئاودەستێک دانیشتووە و جوڵەی پاڵەوانەکان دەکات.

عەرەبانەیەک بە ٤ تایەوە.

لاپەڕەکانی کتێبێک دەکەینەوە و دەخوێنینەوە.

ئاولەپی دەستمان بۆ تێنس بەکاردەهێنین.

ڕەشاشی ئاوێک ٦ گوللە لەجێتی ئاو دابەزێنێت.

پانتۆڵێک لەسەر شێوەی ژمارە ٧ و بە هەڵگەڕاوەیی.

عەزێیەکی فراوان لەسەر شێوەی ژمارە ٨.

پاسکیلێک گۆچانەکەی باپیرمی پێدا هەڵواسراوە.

باڵەخانەیەک ئاودەستەکانی لەسەر بانەکەیەتی.

▪ دەستت لەسەر ڕاهێنانەکە دابنێ و لە خۆت بپرسە، ٤ شتێك لە ژمارە ٩ دایە. چی لە ژمارە ١ دایە... هەروا ژمارە ٥....

▪ بە دووبارەکردنەوەی ڕاهێنانەکە، دەبێتە ڕێگەیەك بۆ لەبەرکردنی زانیارییەکان بەشێوەیەکی یەکسەرکار.

## ڕاستەوخۆ دوای وانەکە، چی دەکەیت؟

**١- خوێندنەوەی وانەکە بە ڕێگەیەکی باش و بە تەرکیز و ئاگالێبوون و ناسینی بیرۆکە سەرەکییەکانی.**

▪ خوێندنەوەی هەمان وانە دوای ٢٤ کاتژمێر بە ڕێگەیەکی نوێ.

▪ خوێندنەوەی هەمان وانە دوای هەفتەیەك.

▪ خوێندنەوەی هەمان وانە دوای مانگێك.

▪ خوێندنەوەی هەمان وانە دوای ٦ مانگ.

**وانەکە بەرەو یادگەی دوومەودا گوێزرایەوە.**

هەندێك زانیاریی هەن پێویستیان بەوەیە زیتر لە جارێك دووبارە بکرێنەوە تا بە باشی لێیان تێبگەیت:

▪ خوێندنەوەی یەکەم جار بە تەرکیزەوە تا بیرۆکە سەرەکییەکانی بزانیت.

▪ خوێندنەوەی دووەم بۆ تێگەیشتن.

▪ خوێندنەوەی سێیەم بۆ جێکردنەوە.

■ خوێندنەوەی چوارەم دەست بە ڕێگەکانی یادگە بکە تاکو بە دروستی عەمباری بکەیت و بە ئاسانی بیگێڕیتەوە.

## ٢- بەستنەوەی زانیارییەکان بە شتێکەوە کە خۆشت دەوێت..

■ بەکارخستنی بەستنەوەی پیتەکان بە یەکترەوە: ناونیشانێکم هەیە و دەمەوێت بیر خۆمی بهێنمەوە. لە هەموو وشەیەك یەکەم پیتی بگرە و وشەیەکی پێکەنیناوی لێ دروست بکە و با ئاوازێکی مۆسیقیشی هەبێت.

■ لە ڕێگەی گوتوبێژکردنی وانەکانەوە لەنێوان خۆت و هاوڕێکانت یان لەگەڵ مامۆستاکانتدا.

■ شێوازی خۆت لە گێڕانەوەی زانیارییەکە و ڕاڤەکردنیدا بەکار بهێنە.

■ بۆ جێگیرکردنی زانیارییەکان و چەسپانیان، نووسین بەکار بهێنە و با بە شێوازی خۆت بێت.

■ کۆمپانیکانی ڕیکلامکردن بهێنە خەباڵی خۆت و، ڕیکلامێك کە بە دڵی خۆتە بهێنە خەیاڵ و زانیارییەکانی تێدا بگێڕەرەوە و، بە ناوی بەرهەمێکی دیاریکراوەوە بیبەستەوە.

■ لەو بابەتانەی قورسن و بێزارکەرن، وا خەیاڵ بکەرەوە و وێنای بکە گوایە پێکەنیناوین و وێنەی جوڵاویان بۆ دابنێ.

## ٣- ئاماژە ئەرێنییەکان بە هەستکردن بە بەختەوەریی و هیوا و گەشبینییەوە بەکار بهێنە تا دەبنە بیروباوەڕێکی بەهێز.

■ من هێور و زۆر لەسەرخۆم.

■ من بەهێزم و دەتوانم تەرکیز بکەم.

■ من فێرخوازێکی سەرکەوتووم.

■ من بە ئاسانی و بە قووڵبوونەوەوە فێردەبم.

■ ئەوەی فێری بووم، بەچێژ و سوودبەخشە.

٤- بلێ: لە ماوەی نێو کاتژمێردا ٥ لاپەڕە یان ٦ لاپەڕە دەوردەکەمەوە. کاتێك لە بابەتێکی دیاریکراو بوومەوە، دەڵێم: دیسان دەست پێ دەکەمەوە و ناوی بابەتەکەی دیکە دەڵێم.

■ ستراتیژییەتێك بۆ زاڵبوون بەسەر خاوەخاو و ئەمڕۆ نا سبەی، بۆ مۆخت دابنێ، کاتەکان بە باشترین شێوە بقۆزەرەوە.

## ٥- ئامرازێکی سەرکەوتوو:

■ لە هەر کاتێکدا بوویت، بڕوانە ئەو زانیارییەی دەتەوێت لەبەری بکەیت و بیر خۆتی بخەیتەوە.

■ بە ئاوازێکەوە و بە دەنگی بەرز دووبارەی بکەرەوە.

■ ژمارەیەکی بۆ دابنێ و بە زانیارییەکەوە بیبەستەوە.

■ شێوازێکی جوداکراوە و دیاریکراوی بدەرێ.

■ وێنەکەی بکێشە و بەو ڕەنگەی بەلاتەوە جوانە، ڕەنگی بکە و، لە چیرۆکێکی نامۆ و سەرنجڕاکێشدا خەیاڵی لێ بکەرەوە.



## شەوی تاقیکردنەوە چی دەکەیت؟

- پاڕانەوە و پشتبەستن بە خودا.
- خەوتن بە پێی پێویست.
- خواردنی سووک و وزەبەخش.
- بە زانیارییەکاندا بچۆرەوە و، گرینگەکان پێش چوونە نێو پێخەف بخوێنەوە.

## بەیانی ڕۆژی تاقیکردنەوە چی دەکەیت؟

- پاڕانەوە و پشتبەستن بە خودا.
- ستراتیژییەتی ئۆتوجینێک بەکار بهێنە.
- لە کەساتی نەرێنیی دووربکەوەرەوە.
- زانیارییەکان بە شتەکانەوە ببەستەوە.

## پێش چوونە نێو تاقیکردنەوە چی دەکەیت؟

- پاڕانەوە و پشتبەستن بە خودا.
- زانیارییەکان بە شتەکانەوە ببەستەوە.
- تەرکیز بخەرە سەر هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوەت و بڵێ: الحمد لله... الحمد لله .... الحمد لله.
- لە قسەکردنی نەرێنیی خۆت بەدوور بگرە.

## ڕاستەوخۆ پێش وەڵامدانەوە چی دەکەیت؟

■ پاڕانەوە و پشتبەستن بە خودا.

■ تەرکیز بخەرە سەر هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوەت و بڵێ:

الحمد لله... الحمد لله .... الحمد لله.

■ سەرەتا بە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەست پێ دەکەین کە دەیانزانین.

■ ڕێگەی بیرۆکە سەرەکییەکان پاشان ڕاڤە و شیکردنەوە دەگرینە بەر.

■ ستراتیژییەتی جەستە بەکار بخە، ئەویش بە بەستنەوەی زانیارییەکان بە هەموو بەشەکانی لەشتەوە.



## چۆن تاقیکردنەوەی زارەکیی یان چاوپێکەوتن تێدەپەڕێنیت؟

- پاڕانەوە و پشتبەستن بە خودا.
- زانیارییەکان بە شتەکانەوە ببەستەوە.
- تەرکیز بخەرە سەر پەیام و بیرۆکەکانت.
- نەکەی تەرکیز بخەیتە سەر ئەو کەسانەی لەبەردەمتدان و، وەڵامی بیرۆکە سەرەکییەکان بدەرەوە.

## نەخشە زەینییەکان Mind Mapping

**تۆنی بوزان Tony Buzan وای پێناسە کردووە کە:** تەکنیکێکی وێنەکاریی بەهێزە، چەند کلیلێکت دەداتێ بۆ بەکارهێنانی وزەی ئەقڵت لە ڕێی ڕامکردنی زۆرینەی کارامەییەکانی ئەقڵەوە، وەکی: وشە، وێنە، ژمارە، ژیربێژی، ڕەنگەکان، ئاواز.

شێوازێکی بەهێزە و سەربەستی تەواوت لە بەکارهێنانی وزەکانی ئەقڵتدا دەداتێ.

دەکرێت ئەم نەخشە زەینییانە لە بوارەکانی ژیانتدا وەگەڕ بخەیت و، کار و بیرکردنەوەت باشتر بکەیت و، ڕێگەیەکی ڕوون و بەجێگەیاندنێکی باشت دەست بکەوێت.

### د. نەجیب ئەلریفاعی وا پێناسەی دەکات:

ئامرازێکی سەرکەوتووە لە ئامرازەکانی خوێندن. ئەو زانیاریی و خوێندنەوانەی نێو کتێب بە هۆی چەند وێنە و وشەیەکەوە لەسەر شێوەی نەخشەیەکدا پێکەوە دەبەستێت.

تۆ سەرەتا ئەو بڕگەیەی لەنێو کتێبەکەدا هەیە دەخوێنیتەوە و، پاشان بۆ وشەی کورتکراوەی تێکەڵ بە ڕەنگەکان و شێوەکان دەیگۆڕیت.

دەتوانیت یەک بەشی تەواو لە لاپەڕەیەکدا کورت بکەیتەوە. دواتریش بە سەرنجدان لەو لاپەڕەیە، دەبینیت گێڕانەوە و وەبیرخۆهێنانەوەی زانیارییەکان لە کاتی خوێندن و تاقیکردنەوەکاندا، زۆر ئاسانترن.

### عەبدوللا ئەلعوسمان وای دەناسێنێت:

ڕێگەیەکی زۆر جوانە و پشت بە وێنەکێشانی هەموو ئەوەی تۆ دەتەوێت بە ڕێکخراویی لەسەر یەک لاپەڕە، دەبەستێت.

بە پێی توانا هەوڵ دەدەیت وشەکان بۆ وێنە بگۆڕیت و، شتەکان بە کورتی و بە پوختی دابنێیت و، بە ئاسانی بێنەوە بیرت.

**سەرژمێرییەك لە ئەمریکا:**

ڕێگەی نموونەیی بۆ نووسینەوەی زانیارییەکان لە کۆڕێکدا...






**چالاککردنی دوو پلەکەی مۆخ:**

ئەقڵ وەکی پەرەشووت وایە، کار ناکات تا نەکرێتەوە، نەخشە زەینییەکان کلیلت دەدەنێ تا بتوانیت وزەی ئەقڵت بە ڕامکردنی زۆرینەی کارامەییەکانی وەکی: وشە، وێنە، ژمارە، ژیریێژیی، ڕەنگەکان، ئاواز، بیەکار بخەیت.

# بەکارهێنانەکانی نەخشە زەینییەکان

- لە خوێندندا.
- بۆ باشترکردنی یادگە.
- لە وتارداندا.
- بۆ ژمارەکانی تێلیفۆن.
- بۆ پلاندانان.
- نووسینی وتار و لێکۆڵینەوە.
- داواکاریی ماڵەوە.
- بۆ ڕێزبەندیی.
- بۆ کۆگاکان.
- بۆ یارییەکان.
- بۆ خولەکان.
- بۆ دانانی یاسا بۆ منداڵەکانت.
- بۆ گوزارشتکردن لە هەستەکانت.
- بۆ بڕیاردان.
- بۆ کورتکردنەوەی کتێب.
- خشتەی شەرەف بۆ قوتابخانەکان.
- بۆ مامۆستایان بۆ ڕوونکردنەوە و ڕاڤەکردن.



▪ بۆ بنیتنانی پرۆژەکان.

## کێ دەتوانێت نەخشە زەینییەکان بەکاربهێنێت؛

هەر مرۆڤێك ئەقڵی هەبێت... فێرخواز، بەڕێوەبەر، ژنی ماڵەوە، منداڵ، زانا..



## چەند وتەیەك لەبارەی نەخشە زەینییەکانەوە

**د. سەلاح ئەلراشید دەڵێت:**

ئێستە ئەوە بووەتە شتێکی سادەی سەرەتایی بابەتێك بنووسیت یان کتێبێك پوخت بکەیتەوە بێیت و بەقەڵەم وەکو یاداشتێك بینووسیت، بەڵکو ئێستە باو باوی نەخشە زەینییەکانە.

**د. تاریق سوەیدان دەڵێت:**

نەخشەی زەینی زۆر سادەیە، من وەکو خۆم بەردەوام لە نووسینەوەی کتێب یان ئامادەکردنی ئەلبومەکانمدا بەکاری دەهێنم. هیچ ئەلبومێکم نییە مەگەر نەخشەی زەینی هەیە، تاکو وات لێ بکات، بۆ نموونە: دەوازەی چوونە نێو کۆمپانیاکەت دیزاین بکەیت.

**د. نەجیب ئەلریفاعیی دەڵێت:**

بێگومان خۆڕاهێنان لەسەر ئەم شێوە نوێیەی کۆششکردن و خوێندن، بەجێگەیاندنی فێرخواز لە تاقیکردنەوەکاندا باشتر دەکات و بە شێوەیەکی سووك و ئاسان نمرەی بەرزی دەست دەکەوێت.

## سوودەکانی نەخشە زەینییەکان

**تۆنی بوزان:**

- تێڕوانینێکی گشتگیرت لە بابەتە گەورەکاندا دەداتێ.
- دەتوانیت پلانی ڕێگە-کارکردن دابنێیت، لەکوێوە هاتوویت و بەرەو کوێ؟
- کۆکردنەوەی گەورەترین بڕی زانیاریی و داتاکان.
- لە چارەسەرکردنی کێشەکەدا ڕێگەی هەمەچەشن و چارەی جۆراوجۆرت دەداتێ.
- وات لێ دەکات زێتر چالاک بیت.
- وێنە نەخشێنراوەکە بۆ سەیرکردن و خوێندنەوە و تێڕامان و کۆششکردن بەچێژە.
- وێنە نەخشێنراوەکە سەرنجڕاکێشە و حەوانەوە بە چاو و ئەقڵ دەدات.
- لە هەمان کاتدا ڕێت پێ دەدات وێنە گشتییەکە و درێژەی بابەتە ببینیت.

## د. نەجیب ئەلرِیفاعیی:

- کورتکردنەوەی ئەرکەکان.

- ئاسانی لە ڕێکخستندا.
- بەسەربردنی کاتێکی خۆش بە شێوە و وێنە و ڕەنگەکانەوە.
- بەردەوامبوونی زانیارییەکە.
- دوای ڕاهاتن لەسەری، وات لێ دێت لە هەموو شتێکدا ڕێکخراو دەبیت.
- خێرایی بیرخۆهێنانەوە.
- تەرکیزکردن.

**عەبدوڵڵا ئەلعوسمان:**

- وێنەیەکی گشتگیرت لەبارەی ئەو بابەتەی دەیخوێنیت یان قسەی لەبارەوە دەکەیت، دەداتێ.
- وێنەیەکی ڕوونت دەربارەی شوێنی ئێستەت پێ دەڵێیت.. بە کوێ گەیشتوویت؟ ئامانجت چییە؟ لە کوێوە دەست پێ دەکەیتەوە؟ ڕێگرەکان چین؟
- وات لێ دەکات زۆرترین زانیاریی بە شێوەیەکی چڕ و پوخت لە لاپەڕەیەکدا دابنێیت.
- وات لێ دەکات هەموو ئەوەی بە زەین و بیرتدا بێت، لە لاپەڕەیەکدا دابنێیت.
- وا دەکات بڕیارەکانت زیتر بیپێکن، چونکی کاتێك هەموو کێشەکە لە لاپەڕەکدا دادەنێیت، دەتوانیت بە تێڕوانینێکی گشتگیر بۆ هەموو

لایەنەکانی، هەموو لەباردابوونەکان، هەموو ڕێگرەکان، هەموو چارە پێشنیارکراوەکان، بە باشترین شێوە بزانیت.

- کاتێک دەست بە وێنەکێشان دەکەیت و هەموو لایەنەکانی دەخەیتە چوارچێوەی لاپەڕەیەکەوە، دەبینیت بیرۆکەکان وەکو هەوری بەهار بەسەرتدا دەگرمێنن و، ڕێک وەکو ئەو ڕێگەیەی ئەقڵ لەسەری دەڕوات، کاردەکەیت.



## ٧ نهێنییەکە بۆ سەعیکردنێکی کارا

■ با میزاجێکی ئەرێنیت هەبێ بۆ سەعیکردن، کات و ژینگەی گونجاو هەڵبژێرە.

■ هەر زانیارییەك لە کتێبەکەدا لێی تێنەگەیشتیت، هێڵێکی بە ژێردا بهێنە.

■ تەرکیز لەسەر بەشێکی کتێبەکە یان چەند ڕامێنانێك بکە.

■ دوای خوێندنەوەی بەشەکە بووەستە و، ئەوەی فێری بوویت بە شێوازی خۆت دابڕێژەرەوە.

■ ئەوەی لێی تێنەگەیشتیت، بۆی بگەڕێوە و دووبارە بیپشکنەوە.

■ ئەگەر لە شتێك حاڵی نەبوویت، پشت بە سەرچاوەی دەرەکیی وەکی کتێب یان مامۆستا ببەستە.

**لەم هەنگاوەدا سێ پرسیار لەبارەی ئەوەی خوێندووتە بکە:**

- ئەگەر نووسەری کتێبەکە ببینیت، چی پرسیار و ڕەخنەیەکی ئاراستە دەکەیت؟
- چۆن ئەم زانیارییانە لە ژیانی ڕۆژانەمدا جێبەجێ بکەم.
- چۆن وا بکەم ئەم زانیارییانە لای فێرخوازەکانی دیکەیش خۆشەویست بن و لێیان حاڵی بن؟

- بەو بابەتانەدا بچۆرەوە کە خوێندووتن، ئەو ڕێگەیەت بیر نەچێت کە یارمەتی داویت بۆ ئەوەی زانیارییەکان لەبەر بکەیت.
- کتێب یان وانەیەک فێری بوویت، بە نەخشەیەکی زەینییەوە بیبەستەوە.



# نەخشە زەینییەکان و فێرکردن

## یەکەم: خوێندنەوە:

Overview – Preview – In view – Review

:Overview

واتە بیرۆکەیەکی بنەمایی لە کتێبەکە وەربگرە.. ناونیشان.. پێشەکیی.. ناوەرۆك.. پاشان نەخشەیەکی زەینی بۆ ئەوە بکێشە.

:Preview

ئێستە لەگەڵ بیرۆکە سەرەکییەکانی کتێبەکەداین، (بەشەکان یان یەکە سەرەکییەکان). بۆ هەر بەشێك نەخشەیەکی زەینی بکێشە(قۆناغی مەبدەئی)، پاشان پێشەکی بەشەکە بخوێنەرەوە(ئامانجی بەشەکە)، کۆتایی بەشەکە بخوێنەرەوە (ئایا ئامانجەکە هاتە دی یان نا؟)، بیرۆکەیەك بۆ هەموو بەشەکە بخوڵقێنە(وێنەکان، خشتەکان).

:In view

دوای کێشانی نەخشەی بەشەکە و دیاریکردنی بیرۆکە سەرەکییەکان، پێویستە بچیتە نێو درێژەی بابەتەکان و هەموو ناونیشانە

سەرەکییەکانەوە، تاکو وەڵامی پرسیارەکانت چنگ بکەوێت. ئەگەر شتێکت بۆ نەخشەکە زیادکرد، بنووسە: یان زێتر.

## :Review

دوای تەواوبوون لە کێشانی نەخشەی بەشەکە، پێیدا بچۆرەوە.



## دووەم: تەرکیز:

### هۆکارەکانی تەرکیز نەکردن:

- قورسیی وشەکان.
- قورسیی تێگەیشتن.
- باری زەینیی.
- خراپ ڕێکخستن.
- لەدەستدانی گرینگیپێدان.

### چۆن تەرکیز دەکەیت؟

وا خەیاڵ بکە تۆ سواری ئەسپێکی سەرشێت بوویت و داناسەکنێت و حەوجێی بەخۆی نییە، زۆر بە ئاگادارییەوە جڵەویت گرتووە و بەرەو ئامانجەکەت تێی دەتەقێنیت، وەلێ کاتێک بۆ ساتێکی کەم بێئاگا دەبیت، ئەسپەکە لە ڕاستە ڕێ لا دەدات و ڕوو لە دۆڵ و نشێوەکان دەکات...

تەرکیز بە شێوەی ئەو ئەسپەیە.

**تێبینییەک:**
لەبیرت نەچێت هەر ٤٠ خولەکێک ٥ خولەک پشوو بدە، تا بەرزترین پلەی تەرکیزت هەبێت و، بەرزترین ئاستی بیرخۆهێنانەوەت بە نسیب بێت.

### سێیەم: پێداچوونەوە:

لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئەوەیان سەلماندووە کە ئەگەر بێتوو تۆ لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا بەو زانیارییانەدا نەچیتەوە کە خوێندووتن، بێگومان ٨٠٪ یان لەدەست دەدەیت، پاشان بە پێداچوونەوە تا هەفتەیەک دەمێننەوە و، بۆ جاری سێیەمیش تا مانگێک.



### لە کۆتاییدا:

دەست بە هۆکارەکانەوە بگرە و، پشت بە دروستکاری هۆکارەکان ببەستە.

ببە لەو تیشکەی جیهان ڕۆشن دەکاتەوە.